زنجیرە تویێشوی بانگخوازان 33

# بــــراوه ودۆڕاو

وەرگێراني
حاجی عبد الجليل

عمر عبد الكافي





چاپی یەکەم

زنجیرە توێشوی بانگخوازان: ٣٢



# براوە ودۆڕاو

دانانی

د. عومەر عەبدولکافی

وەرگێڕانی

حاجی عەبدولجەلیل

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێب: سوپاسگوزاری نیعمەتەکان

بابەت: پەروەردەی ئیمانی

نوسەری: د. عمر عبدالکافی

وەرگێڕانی: حاجی عبدالجلیل

پێداچونەوەی: م. مەلا فتحی زراری.

تایپ ونەخشەسازی وبەرگ: زیلان عبد الجلیل

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٨ز-١٤٢٩ك

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی

سپاردنی (١٨٠٥) ساڵی (٢٠٠٨)ی دراوەتێ

کتێبخانەی مەحوی

هەولێر - بەرانبەر قەڵات - بازاری ڕۆشنبیری –

تەنیشت تاپۆ/ ٠٦٦٢٢٢٣٦٥٠

## بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

سوپاس وستایش بۆ ئەو خودایەی کە قورئانی بەسەر بەندەکەی خۆی دابەزاندووە، وهیچ نارێکی یەکی تیا نەکردوە، پاکی وبێ گەردی هەر بۆ ئەو خوایە وبانگخوازی ڕاستیش هەر بۆ ئەوە کە بە تەنگەوەیە ومژدە پێ بەخشینی واجب وپێویست کردوە: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ال عمران: ١٠٤.

واتە: پێویستە لە ئێوە کۆمەڵێك پێك بێت یان با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگخوازای بکەن بۆ چاکە وفەرمان بکەن بە هەموو کارێکی دروست وباو وقەدەغەی هەموو نادروستیەکان بکەن تا ئەوانە سەرفرازن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە (الله) تاکە وهیچ هاوبەشی نیە وبەلگەی داناوە وتەواو ڕاستەرێی کردوە. ﴿وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ التوبه: ٣٢.

واتە: خوا ناهێلێت ئاواتیان بێتە دی، هیچی دیکەی ناوێت بێجگە لەوەی ئایین ونوری خۆی سەر باخات، وتەواو دیار بکات وهەرچەندە گاور وکافرەکان پێی سەخلەت بن ودڵ تەنگ بن. "ت.ئاسان"

شایەدی دەدەم کە سەروەر وخۆشەویستمان محەمەد ﷺ نێردراوی خوایە: هەروەها پەیام وڕاسپاردەکەی گەیاندوتە جێ وئامۆژگاری خەڵکی کردوە، وتەم ومژی لاداوە، هەتا ڕۆژی کۆچی دوای بۆ خوا تێ کۆشاوە، خوایە گیان تۆش درودی خۆت وصەڵاواتی لەسەر لێ بدە هەروەها وێڕای کەسوکار وهاوەڵان وهاوسەر وشوێنکەوتوانی کە باوەڕیان پێی هێناوە وباوەڕیان بە ستەمکاری دانەپۆشیوە وبەڕاستی ئەوان دڵنەوایی وهیدایەتی خودایان بووە.

ئیدی: برای موسڵمان ڕەمەزان تەواو هەروەکو هەموو شتێك کۆتایی دێت، بەڵام کێ براوەیە وکێ خەسارەت مەند؟ خوایە لە براوە وتۆبەکارانمان بگێڕی نەك ئەو کەسانەی خەسارەتمەند وڕەنجەڕۆ ودورن لە ڕەحمەت، تۆ باڵادەستی بەسەر ئەمە ئەی خوای هەردوو جیهان.

لە ژیانی بەندە پێویستە حیساب کردنی بردنەوە ودۆڕاوی لەسەرەتای هەموو کارێکەوە بێت بۆ وەدەست هێنانی نهێنی وپەنهانی لە خوا پەرستی: مزگەوتەکان پڕ بوون، دەوڵەمەندان بە زەمیان بە هەژاراندا هاتەوە، زمانەکان لە باس کردنی خەڵکی خۆیان گرت، بەلایەنی کەم لە ڕۆژەکانی ڕەمەزان، وبێ بەش بوون لە جگەرەکێشان، وای لێهاتووە ژینگەی وولاتانی موسڵمانان بە دەست جگەرەوە کەوتۆتە کێشەی پیس بوون، ئەگەر کەسێکی جگەرە کێش بە هۆی هەڵکێشانی دووکەڵی جگەرەکێشانی کەسانی تر توشی نەخۆشی بوو، ئەوە ڕۆژی قیامەت لە چاکەکانی

نادەن، هانی یەکتری نادەن بۆ ئەوەی خۆراك بە نەدار وهەژاران ببەخشن، میراتی دەخۆن وهەمووی هەڵدەلوشن، ماڵ وپارە وسامان ودارایشیان زۆر خۆش دەویٚت و (ڕەچاوی حەلاَل وحەرام ناکەن). "ت.ناسان"

برایانی خۆشەویست مرۆڤ لە نیٚوان خۆشی نیعمەتەکان وتاقیکردنەوەدایە کە پیٚویستە لە سەر نیعمەتەکان سوپاسگوزاری بکات، ولەسەر بەلاَکانیش ئارام بگریٚ.

وەلیٚ مرۆڤ ئەگەر ناز ونیعمەتی دنیای بەسەردا باری خوای لەبیر دەکا، هەر چەندە خۆشیەکان کاتین وبەسەر دەچن، بەلاَم خودی خۆشی لەبیر دەچیٚتەوە.

یان کاتیٚك پلە وپایەیەك وەردەگریٚ یان سامانیٚکی دیٚتە دەست یان پلەیەکی کۆمەلاَیەتی دەبی، ئەو کاتە دلَەکوتیٚ دەیگریٚ ودەلیٚ: (ربی اکرمن) واتە: خودا ڕیٚزی لیٚ ناوم. خوا پیٚ ی بەخشیمە ونالیٚ ڕۆژیٚك دیٚ لە دەست دەچیٚ ئەمەش فەزلیٚکی خودایە، بەلاَم ئەو دەلیٚ

من شایانی ئەوەم، چونکە پیاو چاکم وئازام، من خراپە ناکەم ومن خێر خوازم وزەکات دەدەم وخوا پەرستم ومن وام و وام... جا لەبیر دەکات کە ئەو بەخششە بگێرێتەوە بۆ فەزلی خودا.

کاتێ دنیای بەسەردا دەکرێتەوە دەڵێ خودا ڕێزی لێ ناوم، بەلاّم ئەو بەندە ئەگەر شوکرانەی ئەم ناز ونیعمەتە بکات ومافەکانی وەکو خۆی جێ بەجێ بکات، هەروەکو خوای گەورە لەسەری دایناوە، ئەو کاتە خودا بۆی بە زیاد دەکات لەسەر سوپاس گوزاری، هەروەکو دەفەرمووێ: ﴿ولئن شكرتم لازيدنكم﴾ ابراهيم: ٧.

واتە: ئەگەر سوپاس گوزاریم بکەن بۆتان بە زیاد دەکەم.

کەواتە ئەگەر بەندە شوکرانەی خوا بکات ئەنجامەکەی بەزیاد بوونە، واتە تۆ داری سوپاسگوزاری دەچێنی

ڕاوەستاوە لە خوا دەپاڕێتەوە کە لاپەڕەیەکی نوێی لەگەڵ بکاتەوە وبۆ دوا ڕۆژی ژیانی چ کورت وچ درێژ دەست دەکات بە نەخشە کێشان، بەوەی بەندەیەکی گوێ ڕایەڵی خوای گەورە بێت، بەدیار کەوتوە بۆی کە پێش ڕەمەزان خۆ بە زل زانین وگەورەیی دڵی داگیر کرد بوو، وبەخۆ نازین وغروری وڕك لێ بوونەوەی خەڵك وبەکەم زانینی ڕای بەرامبەر وگوێ نەگرتن بۆ ئامۆژگاری خەڵك پێش ڕەمەزان بەڕاستی بێ هێزی کرد بوو، بەڵام کە ڕەمەزان دێت دڵێکی خاکناسا وکەسایەتیەکی نزیکە لە خەڵك، لەگەڵ خێرخوازان بەشداری چاکە دەکات، ئەم مرۆڤە لەڕەمەزان لە نەخۆشی خۆ بە زل زانین ونەخۆشیەکانی تر چاك دەبێتەوە، ئاگاداری خۆ بەگەورە زانین وبەروبوومەکانی بن، واتە خۆبەزل زانین هەستی بەخۆ نازین دەڕوێنێ وغرورو لە سنور دەرچوون دەڕوێنێ، پەنا بەخوای گەورە، ڕك لێ بوونەوەی کەسانی تر وتەماشاکردنی خەڵك بە چاوی کەم لە ناخ دەوروژێنێ، تەنها لە بابەتی خوا پەرستی ودەرچوون

لە گوێڕایەڵی خوا، ئەگەر خوای گەورە ڕێزی لێنای بەوەی پێنج نوێژە فەرزەکان بە ڕێك وپێکی بکەی. ئەکەی رکت لەو کەسانە بێت کە نوێژەکانیان بە تەواوی ناکەن. بەڵکو داوای هیدایەت ورێنمونی بۆ بکە، خوایە پیدایەتی ئەو کەسانە بدەی کە نوێژەکانیان ناکەن. ئەگەر ئەخۆش کەوت بۆی بپارێوە لەخوا بەڵکو دوعاکەت بکەوێتە ئەو سەعاتەی کە دوعای تێدا قەبوڵە. واتە دوعا بۆ کەسی پابەند وناپابەند بە ئایینەوە بکە، وبۆ موسڵمان ونەوانەی دوریشن لە کانیاوی ئیمان، دوعایان بۆ بکە. بۆ سەرپێچیکار، بۆ داوێن پیس، بۆچی؟ چونکە ڕێنوینی ئەوان خێر وخۆشیە بۆ ئێمە ونەوان، چونکە کۆمەڵگا پاك ددبێتەود لەو کەسانەی کە سەپێچی خوای گەورە ددکەن، هەر شوێنێك سەرپێچی وتاوانی کەمبێت خوای گەورە ڕەحمەت ومیهرەبانی خۆی بەسەر بەندەکان دا دەڕێژێ. چونکە تەنها پیاوێك کە لەگەڵ حەزرەتی موسا ببووە هۆی نەبارینی

جا خواش ستایشی دەکات ودەفەرمویٚ: ﴿ففهمنها سلیمان﴾ الانبياء: ٧٩.

واتە: ئیٚمە سولیٚمانمان تیٚگەیاند.

بەلاٚم بۆ ئەوەی وا تیٚ نەگەی کە داود هەلٚەی زۆری هەبوو لە کاتی ناوبژیدا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ففهمناها سليمان واتيناه حكماً وعلما...﴾ الانبياء: ٧٩.

واتە: هەردووکیان دانای وزانای یان هەبوو، چونکە سوپاسگوزار بوون.

﴿اعملوا ال داود شكرا وقليل من عبادى الشكور﴾سبأ: ١٣.

واتە: ئەی ئەوەی داود ئیٚوە بە کردار وگوفتار سوپاسگوزار بن، هەر چەندە کەم لە بەندەکانم سوپاسگوزارن. "ت.ئاسان".

خەڵكینە هەر كە سوپاس وشوكرانە لە ناومان نەما توشی نیگبەتی دەبین، بەو بەشەی كە خودا بۆمانی داناوە ڕازی نین.

لە كاتێكدا منداڵ سوپاسی بابی ودایكی ناكات لەسەر ئەوەی كە پەروەردەیان كردوە وفێریان كردوە وژیانی خۆیان لە پێناوی خەرج كردوە وبە پارە وشەونخونی لە خزمەتی دابووینە، هەروەها دایكی هەموو ژیانی خۆی بەخت كردیە لە پێناوی هەر لە كاتی لە ناو سكی وكاتی بوونی شیرپێ دانی وپەروەردە كردن وشەونخونی شەوان وكاتی نەخۆشی... هتد.

ئەوجا ئەویش سوپاسیان ناكات، بەوەش بەرەكەت لەو منداڵە نامێنێ وئەگەر ژنیشی هێنا بەرەكەت لە خێزانداری نامێنێ وئەگەر منداڵیشی بوو، وەكو خۆی منداڵی لاسار وسورتكی دەبێ وبۆشی ناچێتە سەر

هەروەها زدرەرمەند وخۆل بەسەر ئەو کەسانەیە کە تاکو ئێستا رق وکینە بەرامبەر بە کۆمەڵێکی تایبەت لە موسڵمانانی لە دڵدایە، ئەم کۆمەڵەیە ئەم چینەیان کوشت، ئەم کۆمەڵە لەم کۆمەڵەیە جیا بوونەوە، ئەم چینە دەڵێن: نا، نا ئەم کۆمەڵە ڕەخنە لە دینی خوا دەگرن، بەهەموو برا موسڵمانەکان دەڵێین: با لەسەر ئەوە کار کە کۆکین لەسەری وئەوانی تریش پەلپ وپۆزش وعوزر بۆ یەکتری بێنینەوە.

ئەوەی موسڵمانان وماموستایان وبانگخوازان لەسەری کۆکن دەکاتە (٩٥٪)، بەلأم خاڵە ناکۆك وناجۆرەکان تەنها (٥٪) ن، ئێمە دەمانەوێ لە (٩٥٪) لەگەڵ یەکتری بژین و واز لە(٥٪)ەکە بهێنین، هەر یەکە وڕێگایەکی هەیە بۆ بانگخوازی وخەڵك ڕێنوێنی کردن بۆ دینی خوا، هەر یەکە وبەرنامەیەك بۆ بانگخوازی، هەر یەکە وشێوازێك بۆ بانگخوازی.

بەلاّم خەسارەتمەندان ئەو کەسانەن کە لەسەر خاکێکی دیاریکرا وراوەستاون وهەواو هەوەستیان بۆ ئەم کۆمەڵە وئەو چینە دەڕوات، زەمی موسڵمانان دەکەن وئەوانیش لە چاکەکانیان دەبن، بەڕاستی ئەوە موفلیس ودەست بەتاڵە هەروەکو خۆشەویست ﷺ دەربارەی دەفەرموێت: ئایا دەزانن دەست بە تاڵ وڕەنجەڕۆ ومفلیسی ئومەتی من کێ یە؟ گوتیان: دەست بە تاڵ ئەو کەسەیە کە نە دەرهەم ونەدیناری هەبێ. فەرمووی: نەخێر، موفلیس ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەت بە نوێژ وڕۆژوو وحەج وخێر وچاکەو چاکە کردن بە باشە ونەهی کردن لە خراپە دێت، بەلاّم جوێنی بەوە داوە ونەمەی شکاندۆتەوە وناموسی خەڵکی هەتك کردوە، ئەوجا ئەمانە لە چاکەی دەبەن وکاتێکیش چاکەکانی نەما خراپەکانی خۆیان دەهێنن ودەیدەنێ پاشان فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخ، ئەوە خەسارەتمەندە کە خۆی ودینەکەی فرۆشتوە.

ڕێزی لێ گرتووم وخوا پێی بەخشیوم، ﴿وأما اذا ما ابتلاه فقدر عليه رزقه﴾

واتە: ئەگەر خوای گەورە تاقی کردەوە ڕزقی سوار کرد ودەرگای بژێوی لێ تەنگ کردەوە ئەویش بێ ئاگا بوو لەخوا ئەوە دەڵێ: بۆچی خودا ڕزقی سوار کردوم وتوشی فات وفرِی کردیمە!؟

والله جار هەیە بەندە بەهۆی گوناح کە تووشی دەبێ ڕزقەکەی سوار وتەنگ دەبێ. ئەوها خۆشەویستمان هەواڵمان دەداتێ: (هەر کاتێك بەندە تاوان بکات ئەوە بەرەکەتی بژێوی لێ هەڵدەگیرێ).

ڕزق بۆت بڕایەوە، بەخوا تەواو باوڕ بکە، هێشتا لە زگی دایکت دابووی هەمووی بڕاوەتەوە بۆت دێت.

بەڵام مەسەلە گرنگەکە ئەوەیە یان ڕزقەکە سوار دەبێ یانیش بە لێشاو دێت و بەبەرەکەتە، (خوایە گیان بەرەکەت بخەیە ڕزقمان ولێمان سوار نەکەی ئەی

پەروەردگاری جیهانیان هەر خۆت بەخشندە ورۆزی دەری).

دەربارەی سوار بوونی ڕزق ورزق فراوانی:

بێگومان هەر خوای گەورەیە ڕزقی بە دەستە بۆ هەندێك فراوان وبۆ هەندێکیش سواری دەکات، لەوانەیە بەندە هەیە خاوەن ملیۆن وچەندان ملیاریشە، بەلاّم دلّی تەنگە وبەرچاو تەنگە وبەختەوەر نیە وهەست بە هێمنی ناکات وخەوی لێ ناکەوێ وخواردن بە گیانی ناکەوێ وسواری فرۆکە نابێ ئیللا بە حەبی نوستن نەبێ، هەرچەندە بە قەد قارونیش خوا رزقی پێ بەخشیە بەلاّم لە نیعمەتی شوکرانە بژێری بێ بەشە، جا خوا رزقی سوار کردوە هەر چەندە ملیۆنیشی لە دستە وقەناعەتی نیە وهەست بە بەختەوەدری ناکات. خۆ بەختەوەری بە پارە وسامان نیە. بەلکو بەوە

وسەعاتێك دوو سەعات گوێ لە كتێبی خوا بگریت لە ماموٚستا و نوێژ بكەیت بێ ئەوەی ماندوو بی، ئەم شتانەت بۆ ڕۆن بۆوە كە پێشتر بۆت ئاشكرا نەبوون، بۆیە نیەتی لێبێنە نیەتێكی ڕاستگۆیانە كە لە دوای ڕەمەزانیش لەسەریان بەردەوام بیت، سوێند بەخوا ئەگەر دوای ڕەمەزانیش وا بەردەوام بیت ئەوە ئومەت سەرفراز وسەركەوتو دەبێت ودوژمنانیش دەڕوخێن.

برایانی ڕێزدار: پێویستە مرۆڤ هەلوێستەیەك لەگەڵ خۆیدا بكات لە هەفتەی كۆتایی ڕەمەزاندا، چەندان برا لە ڕەمەزانی ڕابردوو لەگەڵ ئێمەدا نوێژیان دەكرد بەڵام بن خاك كران ومەرگ ئەویان بردەوە وبوونە خەونی شەوان، ئێمەش لەم ساڵەدا كێ دەزانێ كێ دەمێنێ وكێ دەمرێ؟ ڕەنگە پێش جەژن بێ یان دوای جەژن یان پاش چەند ڕۆژێك... پاش حەفتەیەك... پاش چەند مانگێك دەستی مەرگ بمان پێچێتەوە ولەناو گۆری تەنگ وتاریك حەشار بدرێت ولێمان بزر بی وبۆمان ببیتە پەند وئامۆژگاری

بەهۆی ئەوەوە هوشیار بینەوە وهەلوێستەیەك بكەین وبەخۆماندا بچینەوە.

زۆر قسەم لە پێش ڕەمەزان گوێ لێ دەبوو ودوای ڕەمەزانیش هەمان قسە وقەوان دەبیستمەوە وهیچ نەگۆڕاوە، كەواتە ئەو جۆرە كەسە هیچ سوودی لە ڕەمەزان نەكرد، خەسارەتمەدی تەواو بووە وڕەمەزانیس دۆڕاندووە.

خوشكان وبرایانی بەڕێز: پرسیارێكتان لێ دەكەم. ئایا بەڕاستی ئەمن لە سەركەوتوانی ڕەمەزانم یانیش لەوانی دیكە؟ ئەوەیان سیفاتی خۆی هەیە وئەمەشیان سیفاتی خۆی هەیە، جا ئایا سیفەتە خراپەكان چین كە وازی لێ دێنی؟ ئایا لە نوێژی بەیانیان وعیشا دیسان دەتبینمەوە؟ ئایا دیسان پاش ڕەمەزان بەخوا پەرستی دەتبینمەوە؟ ئایا دیسان بەڕووی خۆش دەتبینمەوە؟ ئایا وات لێ دێت كەمم قسە بكەی وكردەوەت زۆر تر بێ، یانیش هەر بەردەوام دەبی كە قسەكەر بی وهەر تەنها خۆت زۆر بلێ ی؟ ئایا باسی ناموس وهەتكی خەلكی دەكەی یانیش واز دەهێنی؟

بوز وسەهۆڵ بوو. تەماشا دەکەن مامە بە بۆنە نەبێ سەردانیان ناکات، ناچار دەبن لە کاتی گیرو گرفت وقات وقڕی وهەژاری وگرفتاری نەبێ لە دەرگای مامیان نادەن، کچە بەستەزمانی بێ باوك دەیەوێ شو بکات ومامی بکاتە بریکاری باوکی، لەو کاتەدا مامەکە دەڵێ والله ئەمن حەقم بەو نیشان نیە، دایکت بێ تامە دایکتان وایە و وایە وئەمنیش کۆمەڵێك منداڵم هەیە وسەرقاڵم ناتوانم...

جا ئەو جۆرە کەسە کە دڵی بەهەتیمان نەسوتێ خۆشی کە مرد کەسیش ڕەحم بە منداڵەکانی ناکات، ج بچینی ئەو دەدوریەوە (کما تدین تدان).

چاکە لە بیر ناکرێ وخراپەش دەمێنێ وپەروەردگاریش نامرێ، هەرچی دەکەی بیکە لەسەر ت قەردە، ودڕك بچێنی دڕك دێتە بەر وقەتێش دڕك مێوە ناگرێ، (بەڵێ ڕێزی هەتیم ناگرن) چاکترین وپیرۆزترین ماڵ ئەو

ماڵەیە کە هەتیمێکی تێدا بێ وخراپەی لەگەڵدا نەکرێ.

کاتێك منداڵێکی هەتیم دەگری: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوە کێ یە ئەم هەتیمە دەگرێنێ کە باوانی لەناو خۆڵدایە ولێی بزرە؟ فریشتەکانم بە شاهێد بن هەر کەسێك هەتیمێکی دڵنەوایی کرد لێی ڕازی دەبم ودەیبەمە بەهەشتەوە. (خوایە گیان لەوانەمان بکە).

هەر کەسێك دەست بەسەری هەتیمێك دابهێنی بە قەد هەر داوە (تاڵە) مووێکی خێری بۆ دەنوسرێ: ﴿وليخش الذين لو تركوا من خلفهم ذرية ضيعافا خافوا عليهم فليتقوا الله وليقولوا قولا سديدا﴾ النساء: ٩.

واتە: دەبا ئەوانەی کە نەوەی لاواز وساوایان لە دوا دا بەجێ دەمێنێ (بەم زوانە دەمرن) با خوا ناسی بکەنە پیشەیان بە گوفتار وکردار، بێگومان خوا بۆ منداڵیان

بێگومان كارەسات ومینەتی پێویستی بە لێكۆلینەوە چارەسەر هەیە، ئەمن بۆ هەموو برایەكی موسڵمان پێشنیار دەكەم كەوا بیر وبۆچونی جوانی خۆی بنوسێ بۆچی ئەم ئیسلامە توشی شكست بووە؟ ئایا بانگخوازەكانی نوستینە یانیش خەڵك پشتی زانایانی بەرداوە ویانیش زانایان خۆیان بێ توانان؟ یانیش هەردوولا لەخوا وپەیامەكەی دووركەوتینەوە؟ ئایا هۆكاری شكستی ئەم نەتەوە ئیسلامە زمانی عەرەبی تێناگەن وگرانە كەخوا لە باریەوە دەفەرمووێت: ﴿ولقد يسرنا القران لذكر فهل من مدكر﴾ القمر: ١٦.

واتە: ئێمە قورئانمان ئاسان كردووە بۆ خوێندنەوە وتێگەیشتن جا ئایا كەس هەیە دەركی حەقیقەت وراستی بكات. "ت. ئاسان"

هەموو كەس چاوەڕێی (شەوی قەدر) دەكات تا دوعای گیرا بێ، بەلام چاوەڕێی سەركەوتنی پەیامی خوا ناكەین، ئەرێ ئەگەر پەیامبەری خودا ﷺ دڵی پێمان خۆش دەبێ؟ ئایا

به ڕاگەیاندنەکانمان ڕازی دەبێ؟ ئایا به ڕەفتارمان لەگەڵ یەکدی ڕازی دەبێ؟ ئایا بەبانکه سوو بەخشەکان وڕییا کارەکانمان ڕازی دەبێ؟ ئایا به کچه سفورەکانمان ڕازی دەبێ؟ ئایا به پڕو پوچیەکانی کۆمەڵگامان دڵخۆش دەبێ؟ ئەگەر عومەری کوڕی خەتتاب بێته شارەك له شارەکانی موسڵمانان، ئایا دەڵێ ئەوانه نەوەکانی حەفسەنە؟ یان نەوەی ئەسما ویان نەوەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزن؟ کەواته هەر دەبێ بیرێك له دەردەکانی کۆمەڵگاکەمان بکەینەوە، ئایا چۆن چارەسەری بکەین؟ من بۆ هەر برایەکی موسڵمان پێشنیار دەکەم کەوا هۆکاری بێهێز بوونی ئەم میللەته بنوسێتەوە لەگەڵ زانایان وبیرمەندان لێی بکۆڵێتەوە وگفتوگۆی له بارەوە بکات، گوێیان لێ بگرێ وقسه بکات بۆ دانانی بەرنامەیەکی چاك بۆ دەرچواندنی میللەت لەم نەهامەتیانه که تێی کەوتووە، یان بەلای کەم بۆ گێڕانەوەی موسڵمانان که پێویسته لەسەری بن ودڵی خۆشەویستەکەیان ﷺ پێ خۆش بکەن؟

هاتووه. (بەڵێ ئەوەی پاداشتی دایكی هەتیو)، كەواتە هۆكاری یەكەمی ڕزق سواری (ڕێزی هەتیو ناگرین.
﴿كلا بل لا تكرمون اليتيم ولا تحاضون على طعام المسكين﴾ الفجر: ١٧-١٨.
واتە: نەخێر بەڵكو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن ونازی پێ نادەن وهانی یەكدی نادەن بۆ ئەوەی خۆراك بە نەدار وبێ نەوایان ببەخشن. "ت.ئاسان"
بەڵێ ئێمە یارمەتی یەكتر بە چاكە نادەین، دەخەوین وپرخەی خەومان دێ ودەخۆین ودەخۆینەوە وڕادەبوێرین كەچی ڕۆڵەكانی فەلەستین بێ ئازوقە وخۆراك وخواردنەوەن، یان ڕۆڵەكانمان لە عیراق لە ناو دەنگی تۆپ وفڕۆكە سەر دەنێینەوە وئێمەش تەقەی سەرمان دێ، ئەوانیش دەكوژرێن.(لەخوا دەپاڕێینەوە كە هەموو موسڵمانان ئاسوودە وسەلامەت بكات).

مرۆڤ ئەگەر ڕەحم بە خەڵكى نەكات ڕەحمەتى خوا لە ئاسماندا بەسەرى دانابەزێ: ((ارحموا من في الارض يرحمكم من في السماء)).

واتە: ئێوە ڕەحم بە سەر زەوى بكەن، خواش لە ئاسمان ڕەحمتان پێ دەكات. (خوايە گيان بە ڕەحمى خۆت ڕەحممان پێ بكەين ئەى پەروەردەگارى جيهانيان).

﴿كلا بل لا تكرمون اليتيم ۞ ولا تحاضون على طعام المسكين ۞ وتأكلون التراث اكلا لما ﴾ الفجر: ١٧ ١٩. ئەو ميراتەى كە مردوو بە جێ دێلێ زندودكان پێش بڕكێ ى لەسەر دەكەن، دەيبەنە بەر دەستى قازى وشايەدى ناحەقى بۆ دەگرن، ماڧى هەتيوان زەوت دەكەن وهەر كەس ميرات لە خاوەنى قەدەغە بكات. خواى گەورەش لە ڕۆژى قيامەت لە ميراتى خۆى كە بەهەشتە بێ بەشى دەكات، هەر كەسێك لە دنيادا بستێك زەوى داگير

الله" واتە لەسین موسڵمانێك توشی گرتن یا مەینەتێ بووە ئەو لێر خەمی بۆ دەخوات!

جا مرۆڤ پێویستە یەکەمین جار خەمی موسڵمانان هەڵگرێ، جا ئەگەر وابوو خواش خەمی تایبەتی خۆی لەسەر سوك دەکات وبەوەش دەبێتە براوە پشت بەخوا، جارێك بەسەرهاتێکم خوێندەوە باسی دوا ڕۆژەکانی دەرچوونی موسڵمانان لە ئەندەلوس دەکات، دەڵێ: لەشکری (فیرەنجە) چاودێرەکی نارد بۆ چاودێری کردنی خاڵی موسڵمانان بۆ ئەوەی بزانن کاتی هێرش کردنیان هاتووە یان نا؟ بۆ ئەوەی بزانن دەتوانن بەسەریان سەرکەون وپاشماوەیان لە ناو ببەن؟ جا جاسوسەکیان نارد وگەیشتە کەناری شاری (قورتوبە)، منداڵێکی هەشت ساڵی دیت وا لە بن دارێ دەگرێ، لێی پرسی ئەوە بۆ چ دەگری؟ منداڵەکە گوتی: دوو چۆلەکە لەسەرداری بوون ومنیش یەك تیرم پێ بوو منیش دەمویست هەردووکیان بگرم وبەیەك بەرد دوو کێشکە بکوژم، بەلأم نەمتوانی هەر یەك کێشکەم پێ کوژرا،

جا جاسوسەکە گوتی ئەوە شتێکی باشە ئەدی لۆ خەمباری؟
گوتی ئاخر ئەگەر (فەرەنجەکان) بیانەوێ خاکەکەم داگیر بکەن منیش تەنها یەك تیرم پێیە، ئەگەر دوو سەرباز بەرانبەرم بوون ناتوانم هەردووکیان بکوژم تەنها یەکیانم پێ دەکوژرێ وئەو یەکەش دەبێتە کەلێنێك بۆ هاتنی دوژمن بۆ ناو وولاتەکەم.
جا جاسوسەکە گەڕاوە وبەسەرکردەکەی گوت: ئەخێر کاتی هێرش نەهاتیە، جا ئەگەر منداڵێك وا بێ دەبێ بابی چۆن بێ؟ فەرەنجەکان بیست ساڵ چاودێریان کرد هەتا ئەوەکانیان گۆڕین، بۆ ئەوەی بزانن ئەوەی داهاتویان چۆنن؟ ئەو منداڵەی هەشت ساڵ بوو، بووە بیست وهەشت ساڵی وبووە باب لە جیاتی باوکی منداڵی هەشت ساڵی لێ پەیدا بوو جا ئەوەکە گۆڕانی بەسەرهاتبوو وخەمیان جودا بوو لەگەڵ جاران.
دیسان جاسوسەکە چۆوە لێواری (قورتوبە) جا گەنجێکی بیست ساڵی دیت دەگریا ولێی پرسی لەبەر چی دەگری؟

## لە نوسراو و وەرگێڕدراوەکانی نوسەر کە چاپ کراون ئەمانەن:

١- بەسەر هاتی تۆبەکاران

٢- چاکسازی دڵان

٣- پەروەردەی ڕۆڵەکان وئاسودەیی خێزان

٤- توێشوی بانگخوازان کە چڵ «٤٠» دانە نامیلکەیە:

١-پەیامێك بۆ کچانی زانکۆ.

٢- تا ببیتە بەختەوەرترین کەس

٣- دادگای دادپەروەری.

٤-چۆن دەبیتە موسڵمان؟

٥- چۆن ورەت بەرز دەکەی؟

٦- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

٧- نەخۆشیەکانی دڵان.

٨- شەمەندەفەری ڕۆژگار

٩-ئیسلام بەبێ ئاینزا.

١٠- ژیر وبێ ئاگا.

١١- لە نهێنیەکانی قورئان.

١٢- ترس وتکا.

١٣- لێبوردەیی.

١٤- سەلیقە.

١٥-بەروبومەکانی گوێڕایەلی.

١٦- بەروبوومەکانی زیکر.

١٧- سوپاسگوزاری ونزا.

١٨- پەیمی بەختەوەری.

١٩- دڵپاکەکان.

٢٠- چارەسەری ڕك وحەسودی.

٢١- نزاو نوێژ.

٢٢- زیکری ڕاستەقینە.

٢٣- گوێڕایەڵی وسەرپێچی خودا.

٢٤- پەندی مردن.

٢٥- ژیانی دلأن.

٢٦- مردنی دلأن.

٢٧- حیکمەتی تاقیکردنەوەی خودا.

٢٨- هاوسەرگیری سەرکەوتوو.

خوایان لێبێ) کەواتە براوە ئەو کەسەیە کەوا خەمی خۆی وبرایانی وهەموو موسڵمانان هەڵبگرێ وێڕای خەمی خاك ونیشتمان.[2]

دۆڕاویش ئەو کەسەیە کەوا وورەی روخابێ ودۆش داما بێ وکاتەکانی بە شتی پڕو پوچ بدۆڕێنێ، وخوا پەرستی بەلاوە گران بێ بەوەش خۆی وبرایانی ومیللەتەکەی لەبیر دەچێتەوە.

لەخوا داوا کارین سەرکەوتوو براوەمان بکات

سبحان ربك رب العزه عما يصفون وسلام على المرسلين

والحمد لله رب العالمين

هەولێر

و. عبد الجليل

بەهاری/ ٢٠٠٨

---

[2] نەك هەر زوو بەرەو هەندەران هەڵبێ بۆ خۆشی خۆی. (وەرگێڕ)

## لە نوسراو و وەرگێڕدراوەکانی نوسەر کە چاپ کراون ئەمانەن:

١- بەسەر هاتی تۆبەکاران

٢- چاکسازی دڵان

٣- پەروەردەی رۆڵەکان وئاسودەیی خێزان

٤- توێشوی بانگخوازان کە چڵ «٤٠» دانە نامیلکەیە:

١-پەیامێك بۆ کچانی زانکۆ

٢- تا ببیتە بەختەوەرترین کەس.

٣- دادگای دادپەروەری.

٤-چۆن دەبیتە موسڵمان؟

٥- چۆن ورەت بەرز دەکەی؟

٦- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

٧- نەخۆشیەکانی دڵان.

٨- شەمەندەفەری رۆژگار

٩-ئیسلام بەبێ ئاینزا.

١٠- ژیر وبێ ئاگا.

١١- لە نهێنیەکانی قورئان.

-بەربەستەکانی وەرگێرانی خوا پەرستیەکان.

-پیاوان تەنیا چوار چینن.

- براوە ودۆڕاو.

- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

-کات.

-لەهەرە پیشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیارێتی یە.

- زمانی خۆت بگرە.

-توڕە مەبە.

-هیوا درێژی.

-ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟